# پەرستار

ژمارە 11
تشرینی دووەم-ی 2013



گۆڤارێکی تەندروستی و رۆشنبیری گشتییە، کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان دەری دەکات

## بایەخدان بە پەرستاری لە کوردستان دا دەستی پێ کردووە

## کاریگەری کۆمپیوتەر لەسەر تەندروستی مرۆڤدا

## 21 سودی رۆیشتن بە پێ

## چۆن خۆت لە شیرپەنجەی پرۆستان دەپارێزی

## چەند ئامۆژگاریەک بۆ ئافرەتانی سکپڕ




چ بکەم ئەگەر پالەپەستوی خوێنم دابەزی چارەسەرم چییە؟
برۆ بە هێمنی لەگەڵ ژنەکەت قسە بکە...

# پەرستار

گۆڤارێکی تەندروستی و ڕوشنبیری گشتییە، کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان دەری دەکات
ژمارە (١١)ی تشرین دووەم-ی ٢٠١٣






خاوەن ئیمتیاز
**کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان**

سەرنووسەر
**هیوا ئەحمەد محەمەد**
Mobil: 0750 4775337
hiwacath@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین
**ڕەیان جوهەر حوسێن**
Mobil: 0750 4736575
yara_emc@yahoo.com

دەستەی نووسەران
* د. کەریم فەتاح عەزیز
* سەرهەنگ قادر ئیبراهیم
* هندرێن یونس نەجم
* شاڵاو فارس ئەحمەد
* نورەدین حەمەدەمین عەلی
* بورهان عەلی حەمە حوسێن
* د. عەبدولقادر حوسین ئەحمەد

نەخشەسازی
**کاوە فاروق عەلی**

ناونیشان:
هەرێمی کوردستان- هەولێر - دوو سایدی نەورۆز- تەنیشت فەرمانگەی ئای تی بی

Eemail: ksnurses@yahoo.com

# ئەو 10 هۆکارەی ژاپۆنیان پێشخستووە



د. کەریم فەتاح عەزیز بەرزنجی
سەرۆکی کۆمەڵە

1. لەپۆلی یەکەمی سەرەتایی تاوەکو پۆلی شەشەمی سەرەتایی وانەی (رێگا بەرەو رەوشت) دەخوێنن. لەم وانەیەدا قوتابیەکان فێری رەوشت و چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکی دەکرێن.

2. لەپۆلەکانی سەرەتایی تاوەکو سێی ناوەندی کەوتن نییە، چونکە ئامانج پەروەردەکردن و چاندنی چەمکەکان و بونیادنانی کەسایەتیە، نەک فێرکردن.

3 - سەرباری ئەوەی ژاپۆنیەکان دەوڵەمەندترین گەلی جیهانن، بەڵام خزمەتکاریان نییەو دایک و باوک خۆیان بەرپرسن لەماڵ و منداڵیان.

4 - رۆژانە بۆ ماوەی 15 چرکە منداڵانی ژاپۆنی لەگەڵ مامۆستاکانیان بۆ خۆیان قوتابخانەکەیان پاک دەکەنەوە، ئەمەش بوەتە هۆی دەرکەوتنی نەوەیەکی ژاپۆنی سادەو پاک وخاوێن.

5 - منداڵە ژاپۆنییەکان فڵچەی ددان شوشتن لەگەڵ خۆیان دەبەن بۆ قوتابخانەو دوای هەرخواردنێک ددانەکانیان پاک دەکەنەوە، بەمەش فێردەبن چۆن پارێزگاریی لە تەندروستییان بکەن.

6 - بەرێوەبەرانی قوتابخانە نیو کاتژمێر پێش قوتابییەکان خواردنەکە دەخۆن بۆ دڵنیابوون لەپاکی خواردنەکە، چونکە ئەوان منداڵەکان بە ئایندەی ژاپۆن دەزانن، لەبەر ئەوە پێویستە پارێزگاریی بکرێن.

7 - کرێکاری پاککەرەوە (کلینەر) لە ژاپۆن پێیدەڵێن ئەندازیاری تەندروستی و مووچەی مانگانەی لەنێوان 5 تاوەکو 8 هەزار دۆلاری ئەمریکیە، پێش دەستبەکاربونیشی دەبێ چەند تاقیکردنەوەیەک بکات.

8 - بەکارهێنانی مۆبایل لەناو شەمەندەفەرەکان و چیشتخانەکان و شوێنە داخراوەکان قەدەغەیە، کاتێک مۆبایلەکەشت بێدەنگ دەکەی لەبری وشەی (silent) وشەی (رەوشت) دەنووسرێ.

9 - ئەگەر چویتە چێشتخانەیەکی کراوە لەژاپۆن دەبینی هەر کەسە بەپێی پێویستی خۆی خواردن هەڵدەگرێ و هیچیش لەناو قاپەکەی بەجێناهێلێ.

10 - رێژەی دواکەوتنی شەمەندەفەر لەژاپۆن تەنها 7 چرکەیە چونکە گەلێکن نرخی کات دەزانن و بە خولەک و چرکە کاردەکەن.



# بایەخدان بە پەرستاری لە کوردستاندا دەستی پێ کردووە

سوپاس بۆ خوای گەورە کە دەسەلاتدارانی تەندروستی لە هەریمی کوردستان دانیان بە گرنگی پەرستاری بۆ دەستەبەر کردنی چاودێری تەندروستی بە کوالیتی باش بۆ خوازیارانی تەندروستی (نەخۆش و ساخ) ناوە و هەوڵ دەدەن کە ئەم پیشەیە رێگای راستی خۆی بگرێتە بەر. هەر چەندە ئەم هەولانە سیستماتیک و بە پێ شیکردنەوەی بارۆدۆخ نیە بەلام خۆی لە خۆی دا هەنگاوێکی باشە. پزیشکان لەوە تێگەیشتونە کە ئەگەر بیانەوێ نەخۆش لە خزمەتگوزاری تەندروستی رازی بێت و ئەم خزمەتگوزاریە بە کوالیتی باش پێشکەش بە خەلک بکرێت، دەبێت بە یەکسانی بایەخ بە هەموو پیشەیەکی تەندروستی بدرێت. چەند مانگی رابردوو هاورێیەکم کە پزیشکە سەردانی گەورەترین و بەناوبانگترین نەخۆشخانە لە سیدنی پایتەختی ئوسترالیا کردبوو، بۆمی گێراوە کە بەرێوەبەری نەخۆشخانەکە پەرستارە، چونکە پزیشکان و چین وتوێژەکانی تەندروستی گەیشتوونە ئەم قەناعەتە کە پەرستار باشتر لە هەموو کەسێک دەتوانیت نەخۆشخانە بەرێوەببات بە شێوەیەک کە هەموو لایەک کاری خۆیان بە دروستی ئەنجام بدەن و ئاستی رەزامەندی نەخۆش لە ئاستێکی بەرزدا بێت. هەروەها ووتی کە لە پزیشکانی ئەو نەخۆشخانە پرسیارمان کرد کە پەیوەندی ئێوە لە گەڵ سابستاف (substaff: وشەیەکە کە تەنیا پزیشکانی عێراق و کوردستان بۆ ستافی تەندروستی جگە لە پزیشک بە کار دەهێنن و مانایەکەی واتە هەموو کەسێک لە پزیشک کەمترە و دەبێت لە ژێر دەستیان بن) چۆنە؟ لە وەلامدا پزیشکەکان پێکەنین و ووتویان سابستاف چیە؟ ئەم وشەیە زۆر نامۆیە و هیچ مانایەکی نیە و لێرە هەموو ئەندامانی تیمی تەندروستی بە یەک ئەندازە گرنگن و جێگای رێزن.

خوشحالم کە بەرێوەبەرایەتی گشتی تەندروستی هەولێر لە پارسالەوە دەستیان پێ کردووە بە دانانی بەرنامەی جیاواز بۆ پێشخستنی پیشەی پەرستاری لە نەخۆشخانەکاندا. دانانی لیژنەیەکەی تایبەت بۆ پەرەپێدانی پیشەی پەرستاری و مامانی لەم بەرێوەبەرایەتیە و یەکەی فێرکردنی بەردەوام لە هەموو نەخۆشخانەکان هەنگاوێکی زۆر دلخوشکەرە و لەوە دلخوشکەرتر ئەوەیە کە لە هەموو هەنگاوەکانیان دا کۆلیژی پەرستاریان وەک سەرچاوەی زانست و پالپشتی گەورە بەشدار کردووە و پشتیان پێ بەستووە کە ئەوە رێگای راستە بۆ دامەزراندنی بناغەیەکی باش و پتەو بۆ پەرەپێدانی پیشەییەک. سەنتەری پەرەپێدان و راهێنانی تەندروستیش بە



**د. حمدیه میرخان احمد**
**دکتورا لە پەرستاری/ سەرۆکی بەشی مامانی/ کۆلیژی پەرستاری**

کردنەوەی خوولی جیاواز و بەشدارکردنی ژمارەیەکی زۆر لە پەرستاران لەم خوولانە دەست بە هەنگاوێکی ووشیارکەرەوە کردووە و دەرگای زانستی کراوەتەوە بۆ ئەو پەرستارانەی خولیای وەرگرتنی زانستی نوێن لە بواری کارکردنیاندا. من دەستخوشی لە هەموو بەرپرسانی ئەم بەرێوەبەرایتیە دەکەم و داوا لە هەموو پەرستارانیش دەکەم کە یارمەتیدەری پرۆسەکە بن. چونکە ئەگەر خودی پەرستاران نەیانەوێت و بەشداری چالاکانە لە هەنگاوەکان نەکەن ئەو ئاواتە قەت نایەتە دی کە پەرستاری لە کوردستان وەک پیشەیەکی زانستی و کارا و گرنگ بناسرێت و نەخۆشەکانیشمان هیچ کاتێک ناگەنە رەزامەندی تەواو.

# چۆن خۆت لە شێرپەنجەی پرۆستات دەپارێزی

د.عبدالقادر حسين احمد



پیاوێک دەگێڕتەوە دەڵێت کاتێک تەمەنم 54 ساڵ بوو، زۆر میزم دەکرد، هەندێ جار 30 خولەک جارێک. ئەو نیشانەیە وای لێ کردم سەردانی پزیشک بکەم. بۆم دەرکەوت دەبێت پرۆستاتەکەم هەڵبگرم. ئەو جۆرە نەشتەرگەریە لەدونیادا باوە. جا پیاو چی بکە تا خۆی لەم بارە بپارێزێ؟ کەی دەبێت بەدوای ئامۆژگاری تەندورستی بگەڕێت؟

### پرۆستات چی یە

پرۆستات گلاندێکی شێوە گوێزە دەکەوێتە ژێر میزڵدانەوە دەوری میزەڕۆ دەدات، کێشی 20 گرام دەبێت، قەبارەی 2×3 ×4 سم دەبێت لە کەسێکی پێگەیشتو. ئیشەکەی دروستکردنی شلەیەکە نزیکەی 30 % قەبارەی تەواو پێک دەهێنێت. ئەوشلەیە پێکهاتووە لە ترشی لیمۆ (ستریک)، کالسیوم و ئەنزایمەکان. کە یارمەتی دەرن بۆ جوولەو مەلەکردنی سپێرمەکان و پیتینکردن. هەروەها ئەو شلەیەی لە پرۆستات دەردەهاوێژرێ ماددەی زنکی تیایە کۆئەندامی میزەڕۆ لە هەوکردن دەپارێزێ.



### نیشانەکانی نەخۆشی پرۆستات

تاو و ئازاری میزڵدان و گون و نارەحەتی میزکردنی لێ دەردەکەوێت. کاتێک پرۆستات زۆر دەئاوسێت دەبێتە ڕێگری میزکردن. گەر هەوکردنەکە هۆکارەکەی بەکتریا بێت، ئەوە پێی دەوترێت هەوکردنی پرۆستات کەتیژ یا بەردەوام دەبێت (acute or chronic). وەئەگەر بەکتریا نەبێت ئەوە پێی دەوترێت هەوکردنی پرۆستاتی بێ بەکتریا.

لەهەرە کێشەباوەکانی پرۆستات زوو زوو میزکردنە بەتایبەتی لەشەوان و هەستکردن بەبەتاڵ نەبونی میزڵدان. ئەونیشانە زیاتر بۆ هۆکاری لووی خۆشخو (benign prostatic hyperplasia BPH) دەگەڕێتەوە. لەوانەیە لە 40 ساڵی بەسەرەوە پیاو توش دەبێت. 25 % لەتەمەنی 50 ساڵی و 50% لەتەمەنی 75 ساڵیدا ڕوو دەدات. هەروەها پرۆستات لەلایەن لووی بەدخووش هێرشی دەکرێتەسەر. بەشێوەیەکی گشتی شێرپەنجەی پرۆستات دەناسرێتەوە تەنها بە پشکنینێکی ڕۆتین، ئەگەر نیشانەکانیش دەرنەکەوێت. لەهەندێک کێسی پێشچوو گلبونەوەی میزو ئاوسانی پرۆستات دەردەکەوێت کاتێک شێرپەنجەکە بۆ ئۆرگانی تر بڵاودەبێتەوە. هەندێ جار پشت یەشەو لاق ئاوسانیش لە ئەنجامی

گیرانی جهازی لیمفاوی دەردەکەوێت. لەوساڵانەی دوای دا تەنها ئەمەریکا 300.000 کێسی سەرەتانی پرۆستاتی تۆمارکردووە و 41.000 ی بەهۆیەوە مردووە. بەپێی زانستی نوێ 30% پیاو لەنێوان 60 بۆ 69 و 67% لە نێوان 80 بۆ 89 توشی شێرپەنجەی پرۆستات دەبن.

## لە کێ و لەکوێ زیاتر ئەم نەخۆشیە دەردەکەوێت؟

بەپێی تۆژینەوەکان دەرکەوتووە دەرکەوتنی ئەم نەخۆشیە لەدوای تەمەنی 50 ساڵی دەردەکەوێت. دوو هەندە زیاتر لەڕەش پێستەکان دەردەکەوێت وەک لە سپی پێستەکان. ڕوودانی ئەم نەخۆشیە جیاوازە لە دونیادا. لە باکووری ئەمەریکا و ئەورووپادا زۆرە، لە خوارووی ئەمریکا مامناوەندییە، لە ئاسیا کەمترە. ئەمە وادەردەخات ژینگەو خواردن پەیوەندیان هەیە بەتوشبوون بە شێرپەنجەی پرۆستات، بۆ ماوە پەیوەندی هەیە بە تایبەتی باوک و برا. بەپێی گووتەی کۆمەڵەی شێرپەنجەی ئەمەریکا هەندێک فاکتەری مەترسیدار (Risk Factor) هەن وەک تەمەن، ڕەگەز، نەتەوە، مێژووی خێزان، جۆری خواردن، کەمی جوولە. خواردنی چەوری ئاژەڵی ئەگەری توشبونی زیاترە لە کەسێکی پارێزگاردا.

## ڕێگرتن لەنەخۆشی پرۆستات

زانست تا ئێستا هۆکاری ئەو نەخۆشیەی نەدۆزیتەوە، باوەڕیان وایە بۆماوەو هۆکارە هۆرمۆن پەیوەندیان پێوەی هەیە. جێگای دڵخۆشیە دەتوانین کۆنترۆڵی دوو هۆکاری مەترسیدار بکەین ئەویش نەکردنی وەرزش و جۆری خواردنە. کۆمەڵەی شێرپەنجەی ئەمەریکا وای بەپەسەند دەزانێت کەم خواردنی چەوری ئاژەڵی و پابەندی خواردنی ڕووەکی لەم نەخۆشیە دەمان پارێزێت. هەروەها خواردنی پێنج جۆر یا زیاتر سەوزەو میوە ڕۆژانە هەروەها نان، دانەوێڵە، مەعکەرۆنە و بەرهەمەکانی دانەوێڵە و برنج و فاصولیا. تەماتە، تریێ، شووتی کە دەولەمەندن بە لایکۆپین، دژە ئۆکسیدن کە یارمەتیدەرن بۆ ڕێگرتن لە تێکچوونی DNA و تووشبون بە شێرپەنجەی پرۆستات. تۆژینەوەکان دەریان خستووە کە گیاو کانزاکانیش یارمەتی دەرن.

کۆمەڵەی شێرپەنجەی ئەمەریکا و کۆمەڵەی مێزەڕۆی ئەمەریکا باوەڕیان وایە پشکنینی وەرزیانەی پرۆستات باشترین پاراستنی ژیانە. سەرکەوتنی چارەسەری پرۆستات لەوەدایە کە لەسەرەتاوە دەست نیشان بکرێت. کۆمەڵەی شێرپەنجەی ئەمەریکا وا ڕادەسپێرێ پیاو لە سەرووی 50 ساڵی یا 45 ساڵییەوە مەترسی دارترین گروپن بۆ توشبون بەشێرپەنجەی پرۆستات کە پێویستە پشکنینی ساڵانە ئەنجام بدەن.

## پشکنینی پرۆستات

تاقیکردنەوەی دژە دروستکەری پرۆستاتی دیاری کراو (Prostate-specific antigen blood test PSA) ئەو دژە دروستکەرە پرۆتینەکە خانەکانی پرۆستات دروستی دەکات. ڕێژەکەی زیاد دەکات لەکاتی نەخۆشی پرۆستات. ئەگەر PSA سروشتی نەبێت ئەوە پێویستە نوشدار بت بینێت و پشکنینی ترت بۆ ئەنجام بدات وەک پشکنینی پرۆستات لە ڕێگای کۆمەوە (Digital Rectal Exam). کاتێک PSA و DRE سروشتی نەبێت ئەوە تاقیکردنەوەی (TRUS Transrectal Ultrasound test) بەکەلکە. وەهەندێ جار نوشدار بڕیاری بایۆپسی دەدات لە پرۆستات.



## خۆپاراستن

خواردنی تەندورست و وەرزشێکی مامناوەندی ئەگەری توشبون بەشێرپەنجە کەمدەکاتەوە هەموو پیاوێک پێویستە پشکنینی ساڵانە ئەنجام بدات ئەگەر هیچ نیشانەیەکی نەخۆشیشی لێ بەدیار نەکەوتبێت.

## چارەسەری پێشنیار کراو

کۆمەڵەی پزیشکی ئەمەریکی لەگەڵ




ئەوتۆژینەوانەی لەکەنەدا و سوید و یابان ئەنجامدراوە، دەریدەخەن 80% ی نەخۆشەکان سوودی زۆریان لە دەرمانی سروشتی Bee Pollen بینیوە کەلەبنچینەدا پێکهاتەیەکی زۆری زینک ە (80ملگم) و هۆرمۆنەکانی تیایە. دەرمانێکی تر Pro 6 ە کەشەش فیتامینی تیایە لەگەڵا کانزا و گیاکان کە پرۆستات بە تەندورست دەهێڵێتەوە، هەروەها Nature-Min Forever کەفورمیولایەکی هەمە کانزاییە زۆرترین کانزا بەلەش دەبەخشێت کەلەلەشدا بەدی دەکرێت. بەهیوای ئەوەی کەس تووشی نەبێت.

# دەبێت ویژدانی مرۆڤ لە پارە گەورەتر بێت



**د. شکر سەلیم شوانی**
دکتورا لە پەرستاری تەندروستی منداڵان

لەگەڵ لە دایک بونی هەرمنداڵێک، هیوایەک لە دایک دەبێت. مرۆڤ بە چاوی هیواوە دەروانێتە ئەو ژیانەی کە خوداوەند دروستی کردووە و منداڵ بە خەڵات پێ داوە، هەموو دایک و باوکێک بەهیوانی نەوەیەکن کە بەردەوامی ژیان ببەخشی. پاراستن و رەخساندنی باشترین ژیان ئەرکی دایک و باوک و لایەنە بەرپرسەکانە. کەچی بەداخەوە ئەم پەپولە نازدارانە بەردەوام لەبەر هەڕەشەی خراپی تەندروستی دان، ئەویش بەهۆی ئەو هەڵە خراپ و کارە قێزەونانەی کە گەورەکان بەرامبەر بە منداڵ دەیکەن، کارە خراپەکان زۆرن و کاریگەرن لەسەر تەندروستی، هەموو چرکەیەک چەندەها منداڵ بەهۆی بەدکاری گەورەکان توشی ئازارو نەخۆشی دەبێت. هەندێک لەو کارانە شۆک بە مرۆڤی ویژدان ساغ دەکات و برینی قوڵ لەناو کۆمەڵگا بەجێدێڵێ.

دەرمـــان یەکێکە لە کارە باشەکانی مرۆڤ و سەدان کەسی لە نەخۆشی پاراستووە. هەموو مان دەزانین کە چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان بە دەرمان دەبێت، ئەو کەسەی نەخۆش نیە نابێت هیچ جۆرە دەرمانێک بخوات، تەنانەت ئەوانەی نەخۆشن ناتوانن هەمو جۆرە دەرمانێک بخۆن بەڵکو دەبێت پزیشکی تایبەتمەند بە نەخۆشیەکە دەرمانەکەو برەکەی دابنێت، دەرمان ماددەیەکی کیمیایی یە چەند سودی بۆ نەخۆشێک هەبێت چەندبارەش زیانی بۆ تەندروستی هەیە. زانستی جیهانی منالآن زۆر گەشەی کردووەو تا گەیشتە ئەوەی کە بیسەلمێنێ منداڵ جیهانێکی جیاوازە لەگەڵ گەورەکان، جیهانی منداڵان پریەتی لە هەوڵدان بەگەیشتن بە راستیەکانی چواردەوری، بۆیە بەردەوام هەر لە چرکەی یەکەمی ژیانیدا بەدوای زانستەکان و پشکنینی چواردەوری خۆی دەگەڕێ. پیاگێت Piaget کە زانایەکی سویسری یە دەڵێت منداڵ لە دوو ساڵی یەکەمی



به دوو ڕێگا بەدوای شتەکانی چواردەوری دا دەگەڕێت. کە پێیان دەگوترێت assemilation and accomodation واتا هەستکردن بە شتەکانی چواردەورو تاقیکردنەوەی شتەکان بۆیە دەست دەکاتە هەموو شتەکانی چوار دەوری و هەموو




شتەکان تاقیدەکاتەوە، هیچ کەس ناتوانێت ڕێگای لێ بگرێت. پاشان بڕیاردەدات کە ئەو شتە باشە یان خراپە بۆ جاری دووەم تێگەیشتنەکەی و ئەزموونەکەی خۆی بەکار دەهێنێت، شتەکان زۆرن کە منداڵ دەیەوێت دەستکاری بکات، هەموو شتەکان، هەرچوار دەوری. لە هەر شوێنێک هەبێت. یەکێک لەو شتانەی کە منال بەدوای دا دەگەڕێت خواردنە، فروێد دەڵێت لە ساڵی یەکەمی ژیانی هەموو شتەکان بۆ دەمی دەبات و تام لەو کارە وەردەگرێت .

ئەو وێنانەی وا لە خوارەوە دەیانبینن دەرمان نین ئەوانە شیرنین کە بازرگانە بەرێزەکانمان بۆ منداڵەکانمان هێناویانە و بازرگانی بە هەستی منداڵانەکان دەکەن. وێنەی یەکەم و دووەم بریتیە لە چوکلات ی شیرینی بەشێوەی دەرمان لەناو ئەو قاوغێکدا کە لە شێوەی قاوغی دەرمانی پێستەدایە، بەڵام ئەوە دەرمان نیە ئەوە شیرینیە کە حەزێکی منالانەیە و هەموو منالان حەز لە شیرینی دەکەن. ئەگەر هەموو شتەکان تاقیبکاتەوەو بۆ جارێک ئەو شتە تاقیبکاتەوە و تامی شیرینی وەرگرێت ئەوە بۆ جاری دووەمیش تاقیدەکاتەوە چونکە تەنها ئەو شتانە تاقیناکاتەوە کە لە جاری یەکەم ئەزمونی وەرگرت و زانی کە بۆ ئەو شایستە نیە، ئەگەر ئاگر بۆ جارێک تاقیبکاتەوە ئەوا جارێکی تر بە بقەی بابەو دایە دور دەکەوێتەوە چونکە جاری پێشتر دەستی سوتاو بۆ هەتا هەتایی ئەزمونی وەرگرت کە ئاگر خراپەو دەبێت بە هەست و ترسەوە مامەڵەی لەگەڵ دا بکرێت. بەڵام ئەگەر حەبێک یان مەرهەمێکی خوارد وای زانی کە شیرنەمەنیە دەبێت چی بقەومێ؟ ئایا کەس دەتوانی ئاکامەکەی بزانێت،باشە منالێک گوناهی چیە ئەگەر کریمێک یان مەرهەمێکی هەتوان، برین، ژانشکان هەردەرمانێکی تر بەم شێوەیە ببینی و تاقینەکاتەوە . ئایا چی دەقەومێ ؟ ئایا دەگاتە پزیشک و چارەی خێرای بۆ بکرێت ؟ کێ تاوانبارە ؟ کێ لێپرسینەوە بکات لەم تاوانە؟

ئەم وێنەیەی خوارەوە وێنەی شیرنەمەنیە لەسەر شێوازی (حەب) من دڵنیام لە 100% ی ماڵەکان ئەو جۆرە دەرمانانەی تێدایەو و هەر لە نزیک ماڵەکەیان و لە دوکانی شیرنی فرۆشەکان ئەو شیرنەمەنیانە هەیە کە لەسەر شێوازو وێنەی دەرمان دروستکراون.

بێجگە لەم دەرمانانە ڕۆژانە منداڵان توشی گرفتی تەندروستی دەبن بەهۆی بەکارهێنانی ئەو یاریانەی کە لە شێوەی (دەمانچەو کلاشنکۆف) دروستکراون بەیاریە ئاگرینیەکان ناسراون.

بازرگانی کارێکە کە تەواوی گەلان سودیان لێ بینیوە بەهۆیەوە باری ئابوری وڵات و تاک بەرزبۆتەوەو هەلی کار بۆ سەدان هەزار هاوڵاتی ڕەخساوە. بەڵام نابێت پارە ئەوەندە پیرۆز بێت لەبەر بەرژەوەندی کەسی و گیرفانی پڕ دا، بازرگانی بە گیانی منداڵان بکەین کە هیواو خۆشەویستمانن. پارە ئەوە ناهێنێت کاتێ منداڵێک بەهۆی حەزو بازرگانیەوە گیانی بکەوێتە بەر مەترسی . بازرگانەکان و لایەنە پەیوەندیدارەکان تەها بەرپرسیارن و بە پلەی یەکەم بازرگانەکان، چونکە دەبێت ویژدانیان بیان جولێنێت و بەرپەرسی کارەکانیان بێت.

وەزارەتی تەندروستی ئەرکیەتی کە بەدواداچون لەسەر ئەوکاڵایانە بکات کە پەیوەستن بە تەندروستی منداڵان و یاساو ڕێسای گونجاو دابنێت بۆ ئەو مەبەستە .

با منداڵەکانمان بپارێزین بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەکی تەندروست بەرهەم بهێنین. با چیتر منداڵەکانمان نەکەین بە قوربانی حەزی بازرگانەکان.

# برینداربونی دڕکە پەتک
# Spinal Cord Injury



**سەدیق سەدر عەلی**
قوتابی ماستەر لەزانستی پەرستاری

برینداربونی دڕکە پەتک یەکێکە لەو کارەساتانەی کە بەسەر دڕکە پەتک دادێ و هۆکارێکی وێرانکەرە کە دەبێتە هۆی لە دەستدانی جوڵەو هەستی کەسەکە لەناکاو، بەمەش دەبێتە کەسێکی کەم ئەندام و کاریگەری دەبێت لەسەر چالاکیەکانی رۆژانەی، ئەم کارەساتە کاریگەری دەکاتە سەر ژیانی کەسانی دەورو بەری و چارەسەرو راهێنانەوەی خێرای پێویستە.

* لە کاتی ئاساییدا دڕکەپەتک جوڵەو هەست دەگوازێتەوە لەنێوان مێشکەوە بۆ بەشەکانی تری لاشە درێژیەکەی لەنێوان 42 بۆ 43 سم لە مێینەدا وە 45 سم لەنێرینەدا.

مێژوی ئەم نەخۆشیە:

مێژوی ئەم نەخۆشیە دەگەرێتەوە بۆ مێژوی کۆنی میسرییەکان پێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا، لەو مێژوەدا چۆنیەتی خزمەتکردنی ئەو بریندارانە کراوە، ئیدوین سمس یەکێکە لەوانەی کە لە 2500-3000 ساڵ پێش میلاد چەند زانستێکی لەلایەن دکتۆری ئامن هۆتیبەوە نوسیوە سەبارەت بەم بابەتە کە دکتۆر جمس بیستد لەزانکۆی شیکاگۆ وەرگێراوە بۆ زمانی ئینگلیزی کە باسی برینداربونی دڕکەپەتک دەکات لە بڕبڕەی ملدا وە چۆنیەتی چاودێری کردنی باس دەکات. پاشان دکتورهیبۆکراد و کلۆدیەس جالن باسی برینداربونی دڕکەپەتکی کردوە لە روی تویکاری و چارەسەرەوە. لەسەرەتای سەدەی یەکەمی میلادی دکتۆر ئۆلاس کۆرتیلیەس باسی لە برینداربونی دڕکە پەتک کردوە بەتایبەت شکانی بڕبڕەی پشت.

پۆلین کردنی برینداربونی دڕکەپەتک: بەپێ ی ستاندەری یەکێتی بریندار بونی دڕکەپەتک لە ئەمەریکا American Spinal Injury Association (ASIA) دابەش کراوە بەم شێوانە:

1 - جۆری A: برینداربون یان پچرانی تەواوی دڕکە پەتک: جوڵەو هەستی ئەندامەکان نامێنێ لەشوێنی بریندابونیەوە.

2 - جۆری B: بریندابون یان پچرانی ناتەواوی دڕکەپەتک: هەستی هەیە بەڵام جوڵەی نامێنێ لەشوێنی بریندابونیەوە.

3 - جۆری C: جوڵەو هەستی هەیە بەڵام زۆر لاوازە.

4 - جۆری D: جوڵەو هەستی هەیە بەڵام کەمە.

5 - جۆری E: جوڵەو هەستی هەیە وهیچ گرفتی نیە.

**جۆرەکانی برینداربونی دڕکەپەتک:**

• ئیفلیج بوون یان پەککەوتنی هەرچوار پەل Quadriplegia،Tetraplegia: برینداربوون لەبڕبڕەی ملدا روودەدات لە نێوان بڕبڕەی دووی مل و بڕبڕەی یەکی سنگ.

• نیوە ئیفلیج بوون Paraplegia کاتێ روودەدات کە برینی دڕکەتک لەخوار بڕبڕەی دووی سنگەوە تاکوو کۆتایی بڕبڕەکان.

• تاک ئیفلیج بوون Mono Plegia تەنها یەک پەلی ئیفلیج دەبی کاتی دەماری یان چەند دەماری لەلقەکانی کە لە دەماری

درکەپەتک دەبنەوە بریندار دەبێ.
* تێبینی: هەندێ جار ووشەی paresis دەبینرێ لەگەڵ ئەو ووشانەی سەرەوە بەواتای هەبونی جوڵەو هەستە بەڵام لاوازە.
هۆکاری برینداربونی درکە پەتک:
• برینداربونی درپەتک رووەدات بەهۆی شکانی بربرەکانەوە بەهۆی:
1. بەربونەوە لەشوێنی بەرز
2. ڕوداوی ئۆتۆمبێل 3. زیادە یان لەڕادەبەدەر نوشتانەوەی بربرەکان بەهەر هۆکارێ وەک کارەساتی کاتی وەرزش کردن.
4. بەرکەوتنی لێدان بەپشت Trauma.

• برینداربونی درکە پەتک بەبێ شکانی بربرەی پشت وەک: بەرکەوتنی چەقۆ، گوللە، پارچەی تەقینەوە.
• برینداربونی درکەپەتک بەهۆی نەخۆشی وەکو شێرپەنجەی درکەتک یان برپرەکان وەک کۆبونەوەی خوێن یان هەوکردن لەدەوەری درکەپەتک یان زیادبونی شلەی دەوری درکەپەتک.
• نیشانەکانی برینداربونی درپەتک:
1. نەمانی هەست وجوڵە لەشوێنی برینداربونی درکەپەتکەوە بۆخوارەوە.
2. ڕەق بوون و کرژبونێکی بەئازاری پەلەکان.

3. لەدەست دانی کۆنترۆڵی میزو پیسایی.
4. جێگیرنەبونی پەستانی خوێن.
دەست نیشانکردنی برینداربونی درپەتک:
1. وەرگرتنی مێژوی ووردی نەخۆش و فەحس کردنی جەستەیی گشت ئەندامەکانی نەخۆش.
2. فەحسی جوڵەو هەستی نەخۆش بربرە بە بربرە.
3 x - ray، تشکی موگناتیسی MRI و تشکی کۆمپیوتەری CT scan.
4. فەحسی تاقیگەیی وەک: ڕێژەی نیشتنی خڕوکە سورەکان ESR، زانینی ئاستی شلەی دەوری درکەپەتک CSF.
چارەسەری برینداربونی درکەپەتک:
1.چارەسەری دەست بەجێی نەخۆش بە نەجوڵاندنی نەخۆش ودانانی کۆلەری مل یان پشت بەپێی شوێنی برینەکە و هەڵگرتنی نەخۆش بەشێوازی تەکنیکی دروست و گواستنەوەی بۆ نەخۆشخانە و چارەسەری فریاکەوتنی خێرای بۆبکرێ first aid.
2. پێدانی دەرمانی ستیرۆیدی لە 3-8 کاتژمێری سەرەتای روداوەکە تاکو 6 هەفتە بۆ 6 مانگیش سودی دەبێ و زۆرگرینگە بۆگەڕانەوەی هەست و جوڵەی نەخۆش بەپێی چەند توێژینەوەیەک لەم بوارەدا کە ئەنجام دراوە.
3. چارەسەری نەشتەرگەری بۆ لابردنی ئەو پاڵەپەستۆیەی لەسەر درکە پەتکە و ڕێک کردنەوەی بربرەکان و جێگیرکردنیان.
4. چارەسەر بە دانانی ڕاکێشان






بۆرێک بونەوەی بڕبڕەکان.

5. ڕاهێنانەوە Rehabilitation: ڕاهێنانەوەی نەخۆش لە سەر کرداروو چالاکی بەردەوامی ڕۆژانەی کە بەگرینگترین چارەسەر دادەنرێ چونکە بۆماوەیەکی زۆر دورو درێژ یان بۆ هەتا هەتایی نەخۆش توشی ئیفلیج بوون دێت بۆیە پێویستە ڕاهێنانەوەی بۆبکرێ لەم بەشانەدا:

1 - ڕاهێنانەوەی لەسەر چۆنیەتی جوڵەی هەستان و دانیشتن و نان خواردن و خۆ شۆردن و پاکو خاوێن ڕاگرتنی خۆی.

2 - ڕاهێنانەوەی لەسەر چۆنیەتی خزمەتی پێست و نەهێشتنی توش بوون بە برین.

3 - ڕاهێنانەوەی لەسەر چۆنیەتی میزو پیسایی کردن.

4 - ڕاهێنانەوەی لەسەر چۆنیەتی چونە دەرەوە بۆ سەیران و بازارکردن و مەشقی ڕۆژانەی.

5 - فێرکردنی نەخۆش و کەس و کاری نەخۆش لەسەر ئەو ڕاهێنانەوانە و بەردەوام ئامۆژگاری کردنیان.

**سەرچاوەکان:**


• Flaherty، A.W. and Rost، N.S. (2007). Massachusetts General Hospital Handbook of Neurology. 2nd ed. Lippincott Williams & Wilkins Company. PP 115، 116.

• Selzer، M.E.، and Dobkin، B.H. (2008). Spinal Cord Injury AMERICAN ACADEMY OF NEUROLOGY (AAN).Quality of Life Guides. [Internet]. AAN Enterprises، Inc. United States of America، New York: [Cited 2012 November 20]. 10016. Available from: http://www.isaarsci.ir%2FPHYSICIAN%2520folder%2Fphyscicianarticle%2Fphysician%2520ebook%2Fsciebook24.pdf.

• Timby، B.K. and Smith، N.E. (2010). Introductory medical-surgical nursing [CD-ROM]. 10th ed. Wolters Kluwer Health | Lippincott Williams & Wilkins: H68ip. Philadelphia، Baltimore، New York، London: CD-ROM. P. 15، 567573-.

• Goetz، C.G. (2007). Textbook of Clinical Neurology [CD-ROM]. University Medical Center Chicago، Illinois، Philadelphia. USA: 3rd ed. Saunders Company، an imprint of Elsevier Inc. CD-ROM. ISBN-13: 978-1-0-3618-4160.

• Steeves، J.D.، Fawcett، J.W.، Tuszynskic، M.H.، Lammertsed، D. Curta A. Ditunno J.F. et al، (2007). Experimental treatments for spinal cord injury، International Campaign for Cures of spinal cord Injury Paralysis. [Internet]. University Boulevard، Vancouver، Canada: International Campaign for Cures of spinal cord Injury Paralysis. [Cited 2012 November 20]. BC، V6T 1Z4. Available from: http://www.sasca.org.za%2FExperimental_treament_for_SCI_07.pdf.

• Lewis، S.، Heitkemper، M.، Dirksen، S.، Aprn، P. and Bucher، L. (2007). Medical Surgical Nursing assessment and management of clinical problem. 7th ed. USA: Mosby Company، Elsevier. P. 209.

# چەند هەنگاویکی سادە بۆ بەهێزبوونی میشکی مرۆڤ و زیادکردنی زیرەکی و تەرکیز

• ئاو خواردنەوەی زۆر بەشیوەی لەسەر خۆیی. میشکی مرۆڤ لەبەر ئەوەی 80%ی لە ئاو پێکهاتووە پیویستیەکی زۆری بە ئاو هەیە و دەماریکیش لەمیشکدا هەیە پەیوەندی بەزیرەکی و بیر تیژی مرۆڤەوە هەیەو بەتەربوونی زیرەکی لە مرۆڤدا زیاد دەبێت.

• هەلمژینی هەوایەکی پاک و بوونی ژینگەیەکی خاوین.

• هەلمژینی هەناسەی قوول بە لووت و دانەوەی بە دەم .

• گویگرتن لە ئاوازی خۆش و دەنگی هێمن و لەسەرخۆ وەک گوێگرتن لەدەنگی بولبول و خورەی ئاوو دەنگی هەوا .

• پێکەنین بە تایبەتی زەردەخەنە.

• بیرکردنەوەو خستنە گەری ژیری .

• راهێنانی بیر بۆ نموونە لە ماوەی 30 چرکەدا 12 ناو بلی کە بە(ش) دەست پی بکات

• تەرکیز کردن لەسەر شتێک بۆ ماوەیەک .

• نوێژکردن بەتایبەتی روانینە شوێنی کرنوش بردن.

• خەوی پێش نیوەروان (القیلولە) یان دوای نیوەروان .

• شەوان زوو خەوتن و بەیانیان زوو لە خەو هەلسان .

• خوێندنەوەی زۆر .

• شت زۆر لەبەرکردن بە تایبەتی قورئان .

• بیرکردنەوە لە شتی پێچەوانە ئەمە جگە لەوەی مێشک بە هێز دەکات تەرکیز زیاد دەکات، دەبێتە هۆی داهێنان و کاریش ئەوەتا دەبینین بیرۆکەی داهێنانی قەلەم لەبیربردنەوەی پێچەوانەوە داهێنرا ئەوەبوو یەکیک لە زاناکان کاتیک بینی قەلەم لە ناو مەرەکەب دایە و ئەودارو قەمیشەی کە نووسینیان پێدەکرد نووکەکەیان لە مەرەکەب هەلدەکێشا تا پێی بنووسن، ئەم زانایە بیری لەوە کردەوە با لەجیاتی ئەوەی قەلەم لە ناو مەرەکەبدابی با مەرەکەب لە ناو قەلەم دابی ئەم قەلەمەی ئێستا ئێمە پێی دەنووسین لەو بیرۆکەیەوە سەریهەلداوەو داهێنراوە.

• زۆر مەلەوانی کردن و خۆشۆردن .

• زوو قاچ فینک کردنەوە بە تایبەتی دوای ماندووبوون .

• لەبەرکردنی رەقەم بەتایبەتی رەقەمی مۆبایل.

• وەرزش کردن بە بەرنامە.

• گرنگیدان بەچەند شتیک لە یەک کاتدا .

• دەست نیشان کردنی خالی لێکچوو لەنێوان دوو شت یان دوو وێنە .

• لێکدانەوەی کەرەستەو پارچە ئامیر و شتی لێک ترازاو .



نورەدین حەمەدەمین عەلی
دەستەی بالا

• لێکدانەوەی ژمارە .

• خواردنی هەنگوین .

• خواردنەوەی ئاوی زەمزەم بەنیازی بیر تیژی .

• ئەم خواردەمەنی و میوانەش زۆر بە سوودن بۆ بە هێزکردنی میشک مۆز، سیو، چەرەزات، باوی، گویز، سەوزەوات، تریی رەش، میووژ، کونجی، گۆشتی ماسی، جەرگ، میشکی ئاژەل، پەنیرو کەری و قشتە، خورما، گیزەر، هەنجیر، گیلاس، زەیتوون.

# Pulmonary edema وەرمینا سیها –
# سەرەدەریا نەساخین وەرمینا سیهاهەی




**یاسر محمدأمین ئاکرەیی**
بکالوریوس ل زانستێ پەرستاری
Yasir.nurse@gmail.com


دەمێ خینا پیس ل لایێ راستێ دلی بو سیها دچیت و یا پاکژ ل سیها بو لایێ چەپێ دلی ڤەدگەرێت و خینا پاکژ ل لایێ چەپێ دلی بو لەشی دچیت ودیسان ل لەشی خینا پیس بو لایێ راستێ دلی ڤەدگەرێتە ڤە،د ڤێ زڤرینا خینێدا هندەک شلە دخینێدا ب شێوێ دەلاندن ل بۆرێن خینێ دەردکەڤیت هەرچەند فشارا خینێ دناڤا سیهادا زووربیت دێ کارێ دەلاندنێ ل سیها دا زێدەتر بیت لەوماوەرمینا سیها چێدبیت ل بەر ئەگەرێ کۆمبونا شلەمەنیا لسەر بۆریچکێن هەوایئەویش لبەر دوو ئەگەرا

• وەرمینا سیها ل بەر ئەگەرێ دلی:.

• تێک چونا خانێت دلی Cardiac tissue damage))

• تێک چونا زڤروکا خینێ(Heart circulation)

• تێک چونا پالداناخینێ ژلایێ دلی ڤە (congestive heart failure)

• تێک چونا لەرزینێت دلی (sever arrhythmia)

• زێدە بلند بونا فشارا خینێ (hypertensive crisis)

• زێدە بونا شلەمەنیا دلەشی دا ب ئەگەرێ تێکچونا گولچیسکا یان زێدە دانا شلەمەنیا ب رێکا خین بەرێن دلی

• وەرمینا سیها نە ل بەر ئەگەرێن دلی :.

• هەلکێشانا گازێن ژەهری ( Inhalation toxic gases)

• چونا شلەمەنیا بو ناڤ سیها وەک پێکهاتیت گەدێ ( Aspiration)

• هەودانەکا زوورا سینگی (Severe infection)

• نیشانێت نەساخیێ :

• کوخکەکا زوور دگەل بلغەمێ و بێن هەلکێشانەکا بلەز

• بێن تەنگ بۆنەکا ئێک سەر

• نە ئارامی و بێن تەنگ بون ل دەمێ نڤستنێ دا

• پیستەکێ تەر و تەزێ

• دل لێدانەکا زوور bpm 100 < HR

• بلندبونا خین هێنەرا دلی یا حەفکێ

• دەنگ دگەل هەناسەدانێ





چارەسەری :.

وەرمینا سیها تێتە هژمارتن ل وان نەساخیێت چارەسەریا وان بلەز تێتە کرن .

گرنگترین مەبەست بو چارەسەرکرنا بلەز زێدەکرنا ئوکسجینێ یە و کێم کرنا کومبونا ئاڤێ یە ل سەر سیها، ئەگەر دشیان دا بو دگەل چارەسەریێ هەوڵ بدە ئەگەرێ دروست بونێ بزانی داکو ب ساناهی تر ئەگەرێ وێ کێم بکەی یان رابوەستینی .

• ئوکسجین O2 :. ب رێکا دەمامکێن ئوکسجینێ ( دەمامکێن کیس دگەل دا باشترە) یان دانانا بوریا گەریێ و ئامێرێ هەناسەدانێ ئەگەر پێتڤی کر .

• مورفین :. بو ئارامکرنا نەساخی و کێم کرنا بەرگریا دژی پەمپدانا دلی چێ دبیت .

• میزپێ کەر (Diuretics) :. کێم کرنا شلە مەنییێت زێدە د لەشی دا کێم کرنا فشارا خینێ لسەر سیها

• بەرفرەکەرێن رێکێن خینێ (vasodilators Nitroglycerine) کێم کرنا بەرگریا خینێ د خین بەر و خین هێنەرادا،کێم کرنا فشارا خینێ.

• ئەمینوفلین (Aminophylline):. بو پاراستن ل گەشەنگ بونا بورێن هەوای، بەلێ یا گرنگە لێ هشیاربی ل سەرخو بدەیە نەساخی ژبەرکو چێ دبیت لێدانێت دلی هێشتا زێدەتر لێ بکەت .

• ئەوکارێن ڤێتن پەرستار ب شێوەیەکێ لەز بکەت بو نەساخی وەرمینا سیها هەی.

• دانا ئوکسجینێ O2

• بلندکرنا سەرێ نەساخی یان دانانا نەساخی بشێوێ رینشتی

• چاڤدێری کرنا temp.,HR,RR,B.P، SPO2))

• درست کرنا کانیولێ

• چاڤدێریا شێوازێ دلێدانا دلی و هێلکارێ دلی

یاگرنگە پەرستار دگەل نەساخیدا بیت وهاریکاریا وی بکەت بۆ زێدەتر هەلکێشانا ئوکسجینێ و چێکرنا شێوازێ رینشتنانەساخی و تومارکرنا بارێ نەساخی دگورانکارێت کوخکێ ودەنگێ هەناسێ و کاریگەرێن دەرمانێت وەرگرتین،چاڤدێریا رێژا ئوکسجینێ دخانا دا،وبەردەوام گرتنا پشکنینێن خینێ (ABG) بو زانینا رێژا ئوکسجینێ رێژا دوانە ئوکسیدا کاربونێ و ماددێن دیێن دخینێ دا، یاگرنگە هەردەم یێ ئامادەبی بو دەمێ تێکچونا بارێ نەساخی وەکی ئامادەکرنا رێک ڤەکەرا هەوای (Airway) و ئەمبوباک و بۆریا گەریێ (ETT) و تشتێن وێ بو بارێن پێتڤی.

ب بەردەوامی چاڤدێریا دەڤێ نەساخی بکە ل هشک بونێ ل بەر کاریگەریا زوور میزکرنێ و نەساخی ل جهەکێ هێمن دانێ، ڤێتن نەساخ بێتە ئاگەهدارکرن ل وان نیشانێت لەوانەیە تیش ببیت دا ترس نک نەساخی رینەدەت ل دەمێ درست بونا هەر نیشانەکێ و نەساخی فێر بکەی ل چەوانیا دانا هەناسێن کیر ولسەرخو بو زێدەکرنا هەلمژینا ئوکسجینێ .

دێ چەوا زانی بارێ نەساخی چێگیر بو :

ئەگەر... هەناسەدانا نەساخی د خولەکەکێدا ناڤبەینا 12- 20 هەناسابو و نەمانا دەنگێ دگەل هەناسەدانێ و سینگێ نەساخی پاکژ بو ل بلغەمێ و کوخکێ و PH ناڤبەینا7.35 – 7.45، 35 – 45 ,% 92 – 100 SPO2 SPO2 و نەساخ یێ ئارامبیت .

# خەوی تەندروست



**وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە**
**ئەحمەد مستەفا ئەحمەد**
نەخۆشیاری زانکۆ لە کلینیکی
ڕاوێژکاری بەیانیان- ڕانیە

خەوتن زۆر گرنگە بۆ مرۆڤ چونکە ماوەی پشودانی جەستە و ئەقڵە بۆ ئەوەی ڕۆژی دواتر کە هەستا گورج و گۆڵ و چالاک بێت وە بۆ ئەوەی ئەم ئسراحەتەمان دەستکەوێت پێویستە ڕەچاوی ئەم پانزە ئامۆژگارییەی شارەزایان بکەین کە لە خوارەوە باسیان دەکەین :

1 - ئاو و شلەمەنی زۆر مەخۆرەوە پێش چوونە سەر جێگە بۆ ئەوەی ناچاری زۆر چوونە سەر ئاو نەبێت.

2 - لە کاتی ئێواراندا دورکەوەوە لە کافائین و شیرنەمەنیەکان وچالاککەرەکان و هەر ماددەیەکی تر کە دەبێتە هۆی خەو زڕان.

3 - دور کەوتنەوە لە ئارەق خواردنەوە و هاوشێوەکانی سەرەڕای ئەوەی ئەوانە دەبنە هۆی خێرا خەوتن بەڵام نابنە هۆی خەوێکی تەندروست و باش دواتر شێوازی خەو تێکدەدەن.

4 - مەخەوە کاتێک تۆ هەست بە برسییەتی یان تێری زۆر دەکەیت چونکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا ناتوانیت باش بخەویت.

5 - ئەگەر هەستت بە تێرییەکی زۆر یان ئینتەلا کرد دوای خواردنێکی چەور خەوت تێکدەچێت بۆیە چاکتر وایە پەرداخێک ئاو کەوچکێکی گەورەی خەلی سروشتی سێو و کەمتر لە چارەگە کەوچکێکی بچوک (سۆدیۆم بایکاربۆنەیت) ی تێبکەیت و بیخۆیتەوە ئەوە یارمەتی هەرسکردن و تواندنەوەی ئەو چەوریانە دەدات کە خواردوتن و هەست بە ئسراحەت دەکەیت ئەو وەسفەیە بۆ کێش دابەزاندنیش بەکاردێت .

6 - لەو میوە زۆر باشانەی پێوستە سەر لە ئێواران بخورێن بریتین لە مۆز و گێلاس بەتایبەتیش گێلاسی ترش چونکە ئەو دوو میوەیە ماددەی هاندەری خەویان تێدایە.

7 - ئەگەر هەست بە ئازار دەکەیت لە پشتت سەرینێک لە نێوان پێیەکانت دابنێ یارمەتیت دەدات هەست بە ئیسراحەت بکەیت.



8 - حەبی خەو لێخەر بەکار مەهێنە چونکە لەسەریان ڕادێیت.
9 - هەرکە سەرت لەسەر سەرین دانا ئیسراحەت بدە بە ئەقڵت چونکە ئەقڵیش پێویستی بە خەو هەیە بیر لە کار مەکەوە و بیرکردنەوە نێگەتیڤەکان بەلاوەنێ. لە دڵتدا قورئان بخوێنە بیرت ئارام دەکات و دوورت دەخاتەوە لە ژاوەژاوی ژیان.
10 - هەر گڵۆپێکی شین لە ژوورەکەتدا بکوژێنەوە چونکە هەر ڕووناکییەکی شین خەوت لێ تێکدەدات چاکتریش وایە هەموو ڕووناکییەکان بکوژێنیتەوە.
11 - ئارامی و بێدەنگی زۆر گرنگن بۆ خەوی تەندروست . تێکرای ئەو ئامێرانە بکوژێنەوە کە دەنگیان لێوە دێت هەتا سەعاتی دیواریش.
12 - کاتژمێری جەستەت ڕێکبخە بۆ خەوتن و لە خەو هەڵسان لە کاتێکی جێگیردا.
13 - وەرزش یارمەتیدەرێکی زۆر باشە بۆ خەوێکی ئارام بەڵام چاکتر وایە چوار سەعات یان زیاتر پێش خەوتن ئەنجام بدرێت.
14 - جێگەیەکی باش و سەرینێکی باش یارمەتیدەرن بۆ خەوێکی تەندروست بۆیە دڵنیابە لە هەڵبژاردنی جۆری باشی وا کە جەستەت پێیان مورتاح بێت لە کاتی شەودا .
15 - جێگەی خەوتن تەنها بۆ خەوتن بەکاربهێنە لەوێوە سەیری تەلەڤزیۆن مەکە و کار بە کۆمپیتەر و هاوشێوەکانی مەکە بۆ ئەوەی جەستەت لەسەر ئەوە ڕابێت کە جێگەی خەوتن تەنها بۆ خەوتنە .
(بەهیوای خەوێکی ئارام بۆ هەموو لایەکتان)

**سەرچاوە : ئینتەرنێت**





# پرۆگرامی پەرەپێدانی هۆشیاری تەندروستی لە دەزگا پەروەردەییەکاندا

مستەفا گەیلان محەمەد
پەرستاری زانکۆنەخۆشخانەی ئیمێرجنسی

لەبەر گرنگی و هەستیاری بواری تەندروستی، وە هەوڵدان بۆ بەرەو پێش بردنی ئەم بوارە خۆشبەختانە وەزارەتی تەندروستی و سەنتەری هۆشیاری تەندروستی لە پرۆژەیەکی هاوبەشدا هەستان بە دانانی پرۆگرامێک بەناوی (پرۆگرامی پەرەپێدانی هۆشیاری تەندروستی لە دەزگا پەروەردەییەکاندا) بۆ پر زانیاری کردن و هۆشیارکردنەوەی قوتابی و خوێندکارانی قوتابخانەکانی هەرێمی کوردستان لە بواری تەندروستیدا.

ئەم پرۆگرامە لە لایەن چەند بەڕێزێکەوە لە سەنتەری هۆشیاری تەندروستیەوە ئامادەکراوە، دواتر لەرێی کردنەوەی خولێکەوە چەند راهێنەرێک راهێنران لە سەر ئەم پرۆگرامە.

خۆشبەختانە بەڕێوەبەرایەتی پاراستنی تەندروستی هەولێر بەسەرپەرشتی بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستی هەولێر (هۆبەی راگەیاندن) خولێکی (دە) رۆژەیان بۆ چەند کارمەندێکی تەندروستی بە هەموو ئاستەکانیەوە کردەوە، تێیدا ئەم پرۆگرامەو پرۆگرامی راهێنانی راهێنەر (TOT) خوێندرا، بەشداربوان بڕوانامەی راهێنەریان لە بواری تەندروستی وەرگرت. هەروەک لە بیرۆکەی ئەم پرۆژەیەشدا هاتووە لەرێی توێژەری کۆمەلایەتی قوتابخانەکان ئەم پرۆگرامە بگەیەنرێتە قوتابیان، بۆیە لەگەڵ کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکان خۆشبەختانە ئەم پرۆگرامەش خرایە بواری جێبەجێکردنەوە کە راهێنەران لە رێگای خولەوە پرۆگرامی هۆشیاری تەندروستی بە توێژەرە کۆمەلایەتیەکان دەلێنەوە،ئاشکراشە کە ئەرکی قورسی ئەم پرۆژەیە دەکەوێتە ئەستۆی توێژەرە کۆمەلایەتیەکان وە رۆڵی سەرەکی دەبینن لە جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە چونکە ئەوان پەیوەندی راستەوخۆیان هەیە لەگەل قوتابیان.

ئەم پرۆگرامەش لەم بەشانە پێک دێت:-

- دوانزە هەنگاو بۆ سەرکەوتن لە قۆناغەکانی خوێندن
- تەندروستی دەروونی
- خۆراک و تەندروستی
- دەرمان و سەلامەتی دەرمان
- تەندروستی دەم و ددان
- ژینگەی تەندروست
- جولان و وەرزشکردن
- جگەرەو نێرگەلە کێشان هۆکارێکە بۆ خۆکوشتنی بێ دەنگ و هێواش
- ئایدز چییە؟
- ئارایشت و جوانکاری وە کاریگەریان لەسەر تەندروستی
- پاک و خاوێنی
- لەسەر شیرپەنجەی مەمک پێویستە چی بزانیت؟
- بنەما سەرەکیەکانی فریاگوزاری سەرەتایی
- کێش زۆری و قەلەوی

# ئایا نەخۆشی دەروونی واتە شێت بوونە؟

نووسین لەبارەی بابەتە زانستییەکانەوە کارێکی ئاسان نیە بەتایبەتی لەبارەی نەخۆشیە دەروونییەکان، کە تائێستاش بە نەنگییەک (عیب) دادەنرێت لە کۆمەڵگای ئێمەدا. زۆر وشە و زاراوەی نارێک بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهێنرێت کە یەکێک یان زیاتر لە نەخۆشیە دەروونیەکانیان هەیە، وە نەبێ ئەم حاڵەتە تەنها لە نێو کەسانی نەخوێندەوار و لادیی هەبێ بەڵکو لە ئاستە بەرزەکانی خوێندن و لە نێو شارو شارۆچکەکانیشدا هەمان حاڵەتی نەزانین هەیە تەنانەت لە نێوان پزیشکەکانیشدا هەیە کە پسپۆری بوارەکانی ترن، یان پەرستاران و هتد.

زۆرکات پزیشکان، پەرستاران یان خەلکانی تر ئەوانەی نەخۆشی دەروونیان هەیە بەشێوەکی نائاسایی سەیریان دەکەن، لە گەڵ ئەوەشدا زۆربەی پزیشکان و پەرستاران حەز لە خوێندنیش (ماستەر و دکتورا) ناکەن لەم بوارەدا.

لێرەدا گەلێک بۆچوونی هەڵە هەیە سەبارەت بە نەخۆشیە دەروونیەکان بەڵام ئێمە تەنها باسی بۆچوونی شێتی دەکەین:

**نەخۆشی دەروونی واتە شێتییە؟**

ئەم رستەیە خۆی وەڵامی خۆی دەداتەوە یان راستەوخۆی هەڵەی بۆچوونەکە دەخاتە روو چونکە هەرکاتێک ووتمان نەخۆشی ئیتر شێتی هەبوونی نامێنێ، دیارە هیچ نەخۆشیەکیش نیە ناوی شێتی بێت، وشەی شێتی زیاتر وشەیەکی سەرزارەکیە بۆ دەربرینی نارەزایی یان نەشیاوی هەندێک هەڵسوکەوت و رەفتار بەکاردێ، کەواتە وشەیەکی بازاریە یان شەقامیە. هەر لەبەرئەوەشە ئەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشیە دەروونیەکان دەبن ئامادەنین یان نارازین پێان بڵێت نەخۆشیەکەی تۆ دەروونیە، کەچی پێیان خۆشە ئەگەر پێیان بڵی هەر خۆشیەکی تر بۆ نموونە بڵی نەخۆشی شەکرە یان گرانەتا، هتد.

لە جیهانی زانستدا ئەم وشەیە بونی نیە، لەبەرئەوەی هەر حاڵەتێک تۆ پێ بڵیی شێت لە زانستی نەخۆشیە دەروونیەکاندا ناوی تایبەتی خۆی هەیە چونکە سەدەها جۆر نەخۆشی دەروونی هەیە، هەر وەکو حاڵەتێک یان نەخۆشیەک رەفتاری لەگەڵ دەکرێت.

بۆ زیاتر روونکردنەوەی نەخۆشیە دەروونیەکان هەروەکو نەخۆشیەکانی تر وان، ئەویش نەخۆشی دەروونی کتوپر یان درێژخایەنی هەیە، بۆ نموونە هەروەکو هەوکردن بەهۆی ڤایروس و بەکتریا یان نەخۆشی شەکرە، نەخۆشیەکانی دڵ،هتد......

لە کۆتایدا، چەند ئامۆژگاریەکی گشتی بۆ هەموو لایەک:

- هەوڵ بدە بەهیچ شێوەیەک وشەی شێت بەرامبەر بەو کەسانەی کە نەخۆشی دەروونیان هەیە بەکارمەهێنە.
- ئەو کەسانەی کە نەخۆشی دەروونیان هەیە دەبێ بەچاوی مرۆڤانە سەیر بکرێن لە بەر ئەوەی مرۆڤن، وەهەروەها نەخۆشی دەروونی شەرم نیە.
- نابێت بەهیچ شێوەیەک گاڵتە یان سوکایەتیان پێ بکرێت چونکە نە ئاینی ئیسلامی پیرۆز وە نە کەلتوری کوردەواری، نە مرۆڤیەتی رێگە نادات.
- نەخۆشیە دەروونیەکان هەر وەکو نەخۆشیەکانی تر وان، لە بارەی دەستنیشانکردن و چارەسەر.
- هەر کاتێک هەستت کرد کە حالەتێکی دەروونی لە خۆت یان خانەوادەکەت یان کەسو کارت هەیە بەزووترین کات سەردانی نەخۆشخانەی دەروونی بکەن چونکە چەندی زوو نەخۆشیەکە دەستنیشان بکرێت ئەوندە چارەسەر و داهاتووی نەخۆش باشتر دەبێ .



م.ی. موسلیح سابیر کەریم
ماستەر لە پەرستاری دەروونی





# کاریگەری کۆمپیوتەر لەسەر تەندروستی مرۆڤدا



**مراد شیرزاد عثمان**
وەرگێر لە کۆلێژی پەرستاری

ئەمرۆ ژیان پێکهاتووە لە کۆری چاتکردن، ئاراستەکردن، یاریەکانی کۆمپیوتەر، کۆمەڵە شتی تر کە بێ کۆتایە. هەندێک جار چەند کاتژمێرێک تەنانەت چەند رۆژێک بەسەردەبەیت لەبەردەم کۆمپیوتەر بە بێ هیچ جوولەیەک. خواردن و سەرشوشتن لەبیر دەکرێت تەنها پێداویستیەکانی فیسیۆلۆجی ناچارت دەکات بۆ چەند چرکیەکی کەم بچیتە دەرەوە. بەڵام ئایا وا دەزانیت زۆر چاو تێروانینە سکرینی کۆمپیوتەر کاریگەری لەسەرت نییە؟ بەشێک لە ئەو کاریگەرە بریتیە لە کۆمەڵە نیشانەی نەخۆشی بینایی کۆمپیوتەر.

دکتۆر کێنت دۆم، پسپۆری بینایی و چاو، جێگری سەرۆکی کۆلێژی ئیلینیەس بۆ پێوانی دوورو نزیکی بینین لە شیکاگۆ، دەڵێت (کۆمپیوتەر بریتیە لە ژینگەیەکی بەرەنگاربوونەوە بۆ سیستەمی بینین بە شێوەیەکی سەرەکی لەبەرئەوەی وێنەی مێشک ئاوا ئاسان نیە کە بیری لێدەکرێتەوە و هەروەها بۆ چاو بۆ ئاراستەکردن ناخۆشترە لە ئەوەی کە برنتێکی ئاسایی ببینێت).

بە گوێرەی توێژینەوەیەکی نوێ لەلایەن کۆمەڵەی چاویلکەسازی ئەمریکی لەسەر 1000 کەس کە تەمەنیان زیاتر بو لە 18 ساڵ، 82 % زۆر زۆر کۆمپیوتەریان بەکاردەهێنا، 42 % رۆژانە سێ کاتژمێر لەبەردەم سکرینی کۆمپیوتەر بوون، 73 % ناوبریان زۆر ئەنەجام نەدەدا لە کاتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر هەروەکو زۆرجار راسپێردراوە، 10 % هیچ ناوبریان ئەنجام نەدەدا.

(سەرەرای کۆمەڵە نیشانەی نەخۆشی بینایی کۆمپیوتەر، بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر ئاماژە بۆ کێشەکانی مل و شان دەکەن لەکاتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بە تایبەتی ئەوانەی چاویلکەی تایبەتی بەکاردەهێنن بۆ مەبەستی تر «لایەکی چاویلکەکە بۆ بینین لە نزیکەوە لایەکەی تر بۆ بینین لە دوورەوە «لەبەرئەوەی چاویلکەکانیان بۆ ئەم کۆمپیوتەرە نییە بۆ مەبەستی ترە بۆیە ناچار دەبن سەریان دوورو نزیک بکەنەوە لە هەمان کاتدا بۆ بینینی سکرینی کۆمپیتەرەکە ئەوەش بوارێکی زۆر ناخۆش و نەگونجاوە) بە گوێرە دکتۆر دۆم

زۆر جار باسی کاریگەری بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بۆ ماوەیەکی درێژ کراوە. زۆر توێژینەوەشی لەسەر ئەنجامدراوە. وا دابنێت رۆژانە 8 کاتژمێر و پێنج رۆژ لە هەفتەیەک لەبەردەم کۆمپیوتەر کاردەکەیت. ئەگەر چاودێریەکی باشی تەندروستیت نەکەیت بۆ نموونە: دروستکردنی ناوبر بە بەردەوامی لە کلتی ئیشکردن، راهێنان

کردی ڕۆژانە، ڕۆیشتنی زۆر و ڕاکردن بە لایەنی کەمە هەفتەی جارێک، ئەوا وابیر مەکەوە کە تەندروستیت تا هەتایە وەکو خۆی دەمێنێتەوە بەڵکو بەرەو خراپبوون دەچێت. زۆر کێشەی تر هەیە لە ئەنجامە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بۆ ماوەیەکی زۆر دروست دەبێت وەکو لاوازبوونی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان و شلەژانی دەروون و نارێکی نووستن و سەرئێشە و پشت ئێشە و لاوازبوونی تێبینی کردن. هەروەها بەکارهێنانی کۆمپیوتەر ڕۆژێ یەکجار بۆ مەبەستەکانی تەندرۆستی نیشانەکانی پەستی زیاددەکات بەلام بەکارهێنانی بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ برادەرو دۆست و خێزان نشانەکانی پەستی کەمدەکاتەوە.

**ڕێگاکانی بەرگریکردن**
**بە گوێرەی دکتۆر دۆم**

(سەرەتا هەوڵبدە چاوت بە ڕێکوپێکی بپشکێنە و لەگەڵ دکتۆری پسپۆری چاو کاربکە بۆ چارەسەرکرنی ئەم کێشانە. ئەو دکتۆرەی کە شارەزات دەبێت لە چۆنیەتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر کاری جیاواز ئەنجامدەدات و ڕێگەی تایبەتیت بۆ دیاری دەکات بۆ خۆ پاراستن لە ئەو نەخۆشیانە. هەروەها چاویلکەی تایبەت بە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و فلتەری جیاواز هەبە بۆ سکرینی کۆمپیوتەر کە یارمەتیدەردەبن بۆ کەمکردنەوەی نارەحەتی چاو و سووربوونی چاو.)

«کاتێک کۆمپیوتەر بەکاردهێنیت هەوڵبدە چاوت بتروکێنیت. کاتێک زۆر تێبینی دەکەین بە چاو تروکانی چاومان دادەکەوێت دەبێتە هۆی ووشکبوونی چاو. هەر 20 دەقیقە جارێک دوورکەوە لە سەیرکردنی کۆمپیوتەر بۆ ماوە 20 چرکە ئەوەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی گەشەی کێشەکانی چاو و وەرسکرنی چاو کە لە ئەنجامی نەتروکانی چاوەوە دەبێت بە پێی پێویست»

«ڕووناکی یەکجار زۆر هۆکارێکی ترە، بۆیە پێویستە لە کاتی کارکردندا ڕووناکی ئاسایی لە ژووری کارکردن هەبێت بە پێی پێویست بێت واتا نابێت هیچ درەوشانەوەیەک یان کاردانەوەیەک لەسەر سکرینی کۆمپیوتەر هەبێت»

«ئاگاداری چۆنیەتی کارکردن بە سکرینی کۆمپیوتەرەکە دەبێت ڕاست بێت و لەپێشت بێت نابێت بە لاری دابنیشیت و سەیری کۆمپیوتەر بکەیت. مۆنیتەرەکە دەبێت ڕاست بێت لە ئاستی چاو یان کەمێک لە ژێرەوەی ئاستی چاوت بێت.»

O que acontece quando ficamos muito tempo em frente ao **computador?**

1 Olhos ressecados
2 Cansaço visual
3 Pescoço tensionado
4 Postura e coluna
5 Tendão lesionado
6 Inchaço nas pernas
7 Barriga saliente
FAÇA DO JEITO CERTO

# سكچون



**و: هەردی عبدالقادر شێروانی**
پەرستاری نیشتەجێی خولاو

سکچون: بریتییە لە گۆڕینی توندی پیسایی بۆ شل وە زیادبوونی پیسایی کردن لە ڕێژەی ئاسایی . سکچون پێچەوانەی قەبزیە و گەلێک هۆکار هەیە بۆ تووشبون وەکو هەوکردن یان هەونەکردن . (diarrhea) واتا سکچون، وشەیەکی یۆنانیە . لە ڕووی ڕێنوسییەوە لە بەریتانیا وا دەنوسرێت (diarrhoea) بەلام لە ئەمەریکا بەم شێوەیە (diarrhea) . لە شەری جیهانی لە هەر ساڵێک نزیکەی 500 ملیۆن منداڵ تووشی سکچون دەبوون وە ڕێژەیەکیان لێ دەمردن. سکچون ئەگەر چارەسەرنەکرێت ترسناکە و لەوانەیە ببێتە هۆی مردن بە تایبەت لە منداڵ . زۆربەی ئەو منداڵانەی بە سکچون دەمرن، هۆیەکەی لە دەستدانی ڕێژەیەکی زۆری ئاو و خوێیە لە لەشیان بەمەش دەڵێن وشکبوونەوە . وشکبوونەوە کاتێک ڕوودەدات کە بڕی شلەمەنی لەدەستچوو زیاتر بێت لەو شلەیەی دەچێتە ناو لەش . ئەمەش کاتێک ڕوودەدات ئەگەر سکچونەکە توند بێت و ڕشانەوەشی لەگەڵ دابێت. پێویستە هەمووان ئاگاداربن لە بوونی نیشانەکانی سکچون .

**جۆرەکان**

• سکچونی توند : ماوەی کەمترە لە 14 ڕۆژ

• سکچونی بەردەوام : ماوەی زیاترە لە 14 ڕۆژ

**هۆکارەکان**

•لە ڕێگای دەم بەهۆی نەشوشتنی دەست دوای سەرئاوکردن ئەمەش دەبێتە هۆی پیس بوونی ئاو و خواردن .

• لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بڵاو دەبێتەوە لە شوێنی کارکردنی داخراو.

• کەمی ئاوی خاوێن
• شوێنی قەرەباڵغ
• نەبوونی پاک و خاوێنی
• کەمی خواردن
• پاک وخاوێن ڕانەگرتنی زێراب و ئاوی ناو شار
• دەرمانی دژە زیندە هۆکارێکە بۆ تووشبون بە سکچون
• هەستیاری بە دەرمان

**نیشانەکان**

• شلی پیسایی وە پەرش بوونی لە کاتی پیسایی کردن
• ژانە سک
• پێچی سک
• زۆر چوونە ئاودەست
• ڕشانەوە
• هێڵنج





• تا
• ژانەسەر
• نەبوونی ئارەزووی خواردن
• ماندوویی
• خویناوی بوونی پیسایی
پێویستە بە زووترین کات سەردانی پزیشک بکەی لە کاتی بینینی ئەم نیشانانە
• هەبوونی نیشانەی وشکبوونەوە وەک:
• زۆر وشکبوونی دەم
• میز نەکردن یان زۆر کەم میزکردن
• ژانە سکی توند
• بوونی ئازارێکی توندی کۆم
• بوونی خوێن لە پیسایی وە ڕەشبوونی پیسایی
• پلەی گەرمی لە سەرووی 39° پلە بێت
• زۆر خەوالووبوونی منداڵ
• چاڵبوونی سکی منداڵ
• بە قوڵداچوونی چاو یان ڕوومەت (کوڵم) ی منداڵ

**خۆپاراستن**

• شوشتنی دەست بە ئاو و سابون دوای سەرئاوکردن وە پاککردنەوەی میز و پیسایی منداڵ
• دایک شیری سروشتی خۆی بدات بە ساوا
• خاوێنی دەست و جل وبەرگ و یاری منداڵ
• کولاندنی ئاو وساردکردنەوەی ئینجا بدرێت بە منداڵ
• نەخواردنی دەرمان یان پێنەدانی دەرمان بە منداڵ بەبێ چاودێری پزیشک
• پێویستە خواردن باش بکوڵێت بە تایبەت گۆشت
• گەشتیار نابێ ئاوی بەلۆعە بخوات تەنانەت ددانیش پێ بشوات
• پاکراگرتنی زێراب، ئاوی ناوشار و شوێنە قەرەباڵغەکان

**چارەسەرکردن**

• پێدانی شلەمەنی زیاتر وەکو شیری دایک، ئاو و شۆربا یان هەرشلەمەنیەکی تر
• هانی بدە تا خواردنی سوک و بێ ڕیشاڵ بخوات
• پێدانی گیراوەی ئامادەکراو (ORS) : کیسەیەکی گیراوەی ئامادەکراو تێکەڵی یەک لیتر ئاو دەکەیت بە گوێرەی ڕێنماییەکانی سەر کیسەکە تا دەتوێتەوە ئینجا بدە بە منداڵ .ئەگەر گیراوەی ئامادەکراو نەبوو ئەوا دەتوانی لە ماڵ بەم شێوەیە دروستی بکەیت : شەکر بەبڕی هەشت کەوچکی چا وە خوێ یەک کەوچکی چا تێکەڵی یەک لیتر ئاو دەکەیت پاش توانەوە دەتوانی بیدەی بە منداڵ .
• کوتانی ڕۆتو ڤایرەس
• پشوودان
• پێدانی ئازارشکێن لەلایەن پزیشک ئەگەر پێویست بکات

**سەرچاوەکان**


• Essentials of Pediatric Nursing, Sixth Edition
• Pediatric Nursing, Second Edition
• پزیشکی و پەرستاری منداڵان
• گۆڤاری تەندروستی و کۆمەڵ، ژمارە 38
• ئینتەرنێت
• فەرهەنگی ئازادی

# چەند سەرنجێک بۆ گەیشتن بە ئامانج و بەڕێوەبردنی هەر ڕێکخراوێک



ئا: ئاسۆ سەید لقمان
ماستەر لە بەڕێوەبردن و سیستەمی تەندروستی
asomahmood@live.com

1 - بۆ کۆکردنەوەی ئەندامانی بەرچاو پێویستە ئەو ڕێکخراوە بە ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا کارکردنی لە پێناو بەرژەوەندی ئەندامەکانی ڕابگەیەنێ.

2 - هۆکارەکانی پەیوەندی بە سەرکردنەوە بەکاربهێنێ جا چ بە تەلەفون یان ناونیشان یان لە ڕێگەی ڕاگەیاندن.

3 - ڕاو بۆچونەکان بە جددی وەربگرێ و وەڵام بداتەوە.

4 - کارەکان بە گوێرەی پسپۆری دابەش بکات و بەشەکانیش لە یەکتری جیا بکاتەوە و بارەگایەکی شیاو وە بوونی هۆڵی کۆبونەوەکان کە زۆر گرنگە.

5 - کە متمانەت پێکرا یان وەرت گرت ئەوا دەتوانی ئامانجی ڕێکخراوەکەت بۆ بەرژەوەندی گشتی بەکاربێنی وەک پێشکەش کردنی پرۆژە، کە دەبێتە بارسووکی لە سەر حکومەت و پێشوازیەکی بەرفراوان لەلایەن خەڵک.

6 - کۆبونەوەی وەرزی، کۆبونەوەی ناوە ناوە، کۆبونەوەی پێویست، کە ئەمە نابێتە هۆی دابران.

7 - ڕێکخراو یان ئەندامەکانی دەبێت دووربن لە مشەخۆری و گەندەڵی.

8 - هەر ڕێکخراوێک پێویستی بە بەرپرسێکی بەتواناو بە جورئەت و خۆشەویست هەیە بەڵام گرنگە ئەو بەرپرسە ئەنجومەنی ڕاوێژکاری هەبێت کە لە پەنجەی دەست تێپەڕ نەکات و خۆبەخشانە کار بکەن لە پێناو دەرکردنی ناو بانگی ڕێکخراوەکەیان.

9 - پێویستە هەر ڕێکخراوێک بەردەوام بیر لە ئەندامە دەست ڕۆیشتووەکانی نەکاتەوە بو ئەوەی پەیوەندی لە نێوان ڕێکخراو و خەڵک لاواز نەبێت وە پێویست ئەندامی تازە بێنێتە ناو ڕێکخراوەکەوە.

10 - بەردی بناغەی ڕێکخراو ئەندامەکانیەتی لە دوای ئەمانە دەزگاکان وە لە پێشوەی هەموویان (ئامار، پلان)دوە بەردەوامیش هەڵسەنگاندن (تقیم).

11 - پەرەسەندن و پێشکەوتنی ڕێکخراو لە ڕێگەی بەکارهێنانی توانای ئەندامەکانی، هەروەها هەمیشە بە کارەکاندا بچیتەوە لە ڕێگەی چاککردن (ئیسلاح)

12 - لە دەست دانی ئەندام، بە ڕێگەی پێویست ڕێی لێ بگیرێ بە هەوەنتە لە دەستی خۆتی مەدە چونکە یەکێکە لە بەرهەمەکانی ڕێکخراو.

13 - بینا لەسەر وەعدو وعود ڕێکخراو توشی هەرەس هێنان دەکات، ئەمە بۆ ڕێکخراوێکی سیاسی کەلێنێکی گەورەیە پێویستە خۆتی لێ بپارێزی.

14 - ڕێکخراو شوێنی ئامۆژگاری و خوێندنەوە نیە بەڵکو مەڵبەندی کارکردنە لە پێناو ئامانجێک یان زیاتر کە ڕێکخراوەکە بە هۆیەوە دروست بووە.

15 - گلەیی و گازندە و پرتەو بۆڵە لە ڕێگەی شەفافیەت و ڕوونکردنەوە بنەبر دەکرێت.

16 - هەرکاتێ ڕێکخراو توشی قەیران هات ئەوە چار نییە دەبێ بەدوای چارەدا بگەرێ، پەنا بردن بۆ دەستنیشانکردنی هەل و مەرجی نوێ زۆر پیرۆزە ئەگەر لەسەر حیسابی یەکە یەکەی ئەندامەکانیش بێت، چونکە هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخراو کارەساتە لەسەر هەموو ئەندام و دۆستەکان و بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتووری وڵات.

17 - هەر کاتێ دەوڵەت ڕێکخراوی لە مردن ڕزگار کرد ئەوا ئەو ڕێکخراوە دەبێتە داردەستی پیاوانی دەسەڵات بەڵام پێویستە ڕێکخراو پاڵپشت و هاوکاری دەوڵەت بکات و لێ نەگەرێ دەسەڵات دەست لە کاروباری وەربدات ئەمە زۆر پێوسشتە بە وردی و وریایی هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێ.

18 - بەرپرسی سەرکەوتوو تر ئەوەیە کە لە پارەو گەندەڵی و رابواردن بە دوور بێت.

**سەرچاوە:**

(Business Administration)

# چەند ئامۆژگاریەک بۆ ئافرەتانی سکپڕ

**ئا: ئالا یاسین سلێمان**
**دەرچووی کۆلێژی پەرستاری**

1 - جگەرە کێشان زیانێکی زۆر دەگەیەنێ بە کۆرپەلەو دەبێتە هۆی:

- کەمی کێشی منداڵ.
- لە بارچوونی منداڵ.
- مردنی منداڵ لە سکی دایکیدا.

2 - وەرزش لەکاتی سکپڕیدا پێویستە بۆ چالاک کردنی سووڕی خوێن.

وەرزش لەم کاتانەدا زیانی هەیە:

- دایکەکە پێشتر منداڵی لە بارچووی بووبێت.
- فشاری خوێنی بەرزبێت.
- سکەکەی دووانە بێت.
- پێشتر منداڵی بووبێت پێش کاتی ئاسایی خۆی.

هاتوو چۆ لە ناو ماڵدا هەر 2 سەعات جارێک پێویستە بۆ بەرگری کردن لە مەینی خوێن لە ناو خوێنهێنەرەکاندا.

3 - دەرمان

- بەکارنەهێنانی دەرمان بێ ئاگاداری پزیشک لەبەر ئەوەی زۆر دەرمان لە کاتی سکپڕیدا مەترسی بۆ سەر کۆرپەلە دروست دەکات.

4 - جل و بەرگ: ئافرەتی سکپڕ پێویستە جل و بەرگی فراوان لەبەر بکات و جل و بەرگی تەسک و پێڵاوی پاژنە بەرز بەکارنەهێنێ.

- خەو و پشوو دان: ئافرەتی سکپڕ شەوانە بەلایەنی کەمەوە پێویستی بە 8 سەعات خەو هەیە و بە ڕۆژیش پێویستە 2 سەعات بخەوێت یان پشووبدات بەتایبەتی لە کاتی نیوەڕۆیان.

لەکاتی پشوودانادا باشتر وایە ئافرەتەکە لەسەر تەنیشتی لای چەپ پاڵ بکەوێت کە ئەمەش سووڕی خوێنی کۆرپەلە چالاکتر دەکات. هەروەها ئافرەت نابێت کاری قورس بکات و خۆی ماندوو بکات و شتی قورس هەڵبگرێت.

5 - پاک و خاوێنی:

ئافرەتی سکپڕ پێویستە گرنگی بدات بە پاک و خاوێنی لەش و جل و بەرگ. هەروەها گرنگی دانی تەواو بە پاک و خاوێنی و تەندروستی دەم و ددان چونکە لە کاتی سکپڕیدا ڕێژەی کلۆربوون و هەوکردنی ددان و خوێن بەربوونی پووک بە ڕێژەیەکی زیاتر لە سروشتی ڕوودەدات.

6 - خۆپاراستن لە نەخۆشی:

- گرنگی دان بە خۆراک.
- گرنگی دان بە پاک و خاوێنی هەروەک لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کراوە.

7 - کوتان دژی دەردەکوپان:

ئەم کوتانە دایکەکەش و منداڵەکەش لەم نەخۆشییە ترسناکە دەپارێزێ چونکە منداڵی تووش بوو هیچ چارەسەرێکی نییە و تەنها بە کوتان لە مردن ڕزگار دەکرێت.

8 - پشکنینی باری تەندروستی دایک لە کاتی سکپڕیدا:

دایکی سکپڕ پێویستە بە شێوەیەکی دەوری سەردانی یەکەی چاوەدێری دایکان و منداڵان بکات بۆ چاوەدێری و بەدواداچوون بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

- چوارهەفتە جارێک تاوەکو تەمەنی سکپڕی دەگاتە 32 هەفتە.
- دوو هەفتە جارێک تاوەکو تەمەنی سکپڕی دەگاتە 36 هەفتە.
- هەفتەی جارێک تا کاتی منداڵبوون.

ناسینەوەی نیشانەکانی سکپڕی:

- وەستانی خولی مانگانە.
- هێڵنج و ڕشانەوە.
- تۆخ بوونی ڕەنگی گۆی مەمک.
- گۆڕانی ڕەنگی پێست.
- زوو زوو میز کردن.
- گەورە بوونی مەمک و گۆڕانی.





# ئەگەر منداڵەکەت لە قسەکردن دواکەوت... کەی هەست بە ترس دەکەیت؟

ئا: روان بابان

زۆرجار منداڵان لە قسەکردن دوادەکەون، دواکەوتنی قسەکردن لای منداڵان بە شێوەیەکی گشتی بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە:

**1.هۆکاری سروشتی:** وەکو منداڵی یەکەم، بەهۆی ئەوەی کە دایک و باوکی بە شێوەیەکی پێویست گفتوگۆی لەگەڵ ناکەن، یاخود دایک و باوکی بە بەردەوامی لە پێشی لەگەڵ یەکتری قسە ناکەن، بۆیە زۆر گوێی لە وشەکان نابێت، بەمەش وادەکات کە نەتوانی لاساییان بکاتەوە لەکاتی قسە کردن.

**2.هۆکاری دروونی:** ئەمیش چەند هۆکارێکە:

**یەکەم:** لە سەرەتادا دەبێ لیستێک دابنێی لەو وشانەی کەوا منداڵەکەت فێریان بووە تا بزانی کە ئایا منداڵەکەت لە قسەکردن دواکەوتووە یان نا، بۆیە پێویست بە دڵەراوکێی ناکات .

**دووەم:** پێویستە دایک و باوک بزانن بەوەی کە هەر منداڵێک سیفاتێکی خۆی هەیە و بەراوردی لەگەڵ خوشک و براکانی یاخود کەسانی خێزانەکەی نەکەن، هەروەها بە شێوەیەکی گشتیش کچان خێراتر دەست بە قسەکردن دەکەن لە چاو کوڕان.

**سێیەم:** پێویستە لەسەر باوان هەڵسن بە گفتوگۆکردن لەگەڵی، قسەی بۆ بکەن و چیرۆکی بۆ بگێرێتەوە، وای لێبکەن کە ئەویش قسەیان بۆ بکات، هەتا ئەگەر قسەکانیشی تەواو و روون نەبێت گۆرانی بۆ بڵێن و شتی بۆ بگێرنەوە، با بزانێ کە ئەویش وەکو تۆیە و دەتوانی قسە بکات و فێر بێت.

**چوارەم:** پێویستە چاودێری بەردەوامی لەسەر بێت هەر لەوکاتەی لە دایک دەبێت پشکنینی بۆ بکرێت، تاوەکو بزانرێت کەوا ئاستی گەشەکردنی لە هەموو رووەکانیەوە چۆنە.

**هۆکارەکانی دواکەوتنی منداڵ لە قسەکردن**

هۆکاری ئەندامی (العضوية)،

وەکو زمانی بەستراو ئەمەش کە گرفتێکی بەرچاوە، بە ڕێژەیەکی کەم ئەو منداڵانەی کە لە دایک دەبن بەشی پێشەوەی زمانیان بە پشتێنێکی خانەیی (انسجة) بەستراوە بۆ خوارەوە، ئەمەش پێویستی بە نەشتەرگەرییەکی بچوک دەبی، بۆ چارەسەرکردنی لەم کاتانەشدا دەبێ پزیشکی پسپۆر بڕیاری لەسەر بدات گەر پێویست بێت.

**هۆکاری دەروونی:**

یاخود شێوازی قسەکردن (التخاطبية) وەکو زمان گیران و دەرنەبرینی هەندێ پیت لەکاتی قسەکردن ئەمەش لەوانەیە هۆکاری کەمی گفتوگۆکردن بێت لەگەڵ منداڵەکە یاترساندنی بە شێوەیەکی بەردەوام، یاخود خەمۆکی لەبەر لەدەستدانی کەسێکی ئازیزی ناو خێزانەکەی، چونکە منداڵ بە شێوەیەکی گشتی هەست بە لە دەستدانی کەسانی نزیکی خۆیان دەکەن، هەتا ئەگەر کەسێکی بچوکیش بێت واتە (تازە لەدایک بوو).

**هۆکاری جیاوازی زمانی دایک و باوک:**

زۆر جار ئەمە گرفت لای منداڵ دروست دەکات، کاتێک دایک و باوک ڕەگەزنامەیان جیاواز بێت واتە بە دوو زمانی جیاواز قسە بکەن، ئەمەش وا دەکات دوو زمان بچێتە عەقلی و گوێی، چونکە وا لە منداڵ دەکات کە وا لە قسە کردنی دوابکەوێت.

## چۆن وا لە منداڵەکەت دەکەیت فێری زمان بێت؟

- سەرنجی ڕاکێشانی منداڵەکەت بە دەنگی جیاواز بۆ نمونە: زەنگی دەرگا، وایلێ بکە خۆی تاقیبکاتەوە، ئەم جۆرە یاریانەیان بۆ بکرە کە دەنگیان وەکو دەنگی پشیلە و مراوی ....تاد.

- یاری لەگەڵ منداڵەکەت بکە بە دەربڕینی دەنگی سادە بۆ نمونە: دەست بە یاریە ترومبێلەکەوە بگرەو بڵێ دددددیـیـیـیـددددد یاخود، هەندێ دەنگ دروست بکە بە زمانت.

- لە قسەکانتدا هەندێ وشە بەکار بێنە بۆنمونە :تووت یاخود ژژژژژ.

- قسەکردن تێکەڵ بکە بە نیشانەی جیاواز بۆ نمونە: ئەی ئەی ئەی یاخود نانانا بە سەر لەقاندن یاخود ئاگاداری بکەوە بەوەی پێی بڵێی بای بای بابە یان وەرە بە نیشانەی دەستت.

- فێری ناوی خۆی بکە و ناوی بهێنە زۆر ناوی خوشک و براکانیشی بهێنە و پرسیاری لێ بکە و بڵێ (ڤارین) هەرناوێکی بۆ نمونە لە کوێیەوە.. بەم شێوەیە.

- بە بەردەوامی لەگەڵی بدوێ و قسەی بۆ بکە بۆ نمونە: پێی بڵێ یەڵە بابچین نان بخۆین یان دەی با یاری بکەین، دەتوانی هەندێ دەنگی دیار بە کاربهێنی وەکو هەممم لە کاتی نان خواردن یان لە لەکاتی خەوتن ......تا دوایی.

- فێری بکە ڕەنگەکان بناسی لە ڕێگەی تۆپ و دەبدەبە وەکو ئەوە سووره یان شینە وە فێری ناوی گیانلەبەرەکانی بکە یان ناوی میوەجاتەکان وەکو سێو مۆز و پرتەقال....هتد.

- بە پێی تەمەنی و کاردانەوەی بۆ قسەکان فێری بکە بە ڕستەی گەورە وەکو بابە لەکوێیە؟ یاخوت بانگی ڤەدان (هەرناوێک کە لەگەڵیەتی) بکە؟ یان ئەوەتە پشیلەکە لەژێر سەیارەکەوەیە....... هتد.



